وەقفە بۆ ناو مزگەوت

# نوێژی جەماعەت

## زیاترلە (٥٠) سوودوقازانجدا
## بە بەڵگەی قورئان وسوننەت


لەنووسینی

**باوکی عبدالمالیك**

پێداچوونەوەی

**م / سیروان شێروانی**



١٤٣٥ک – ٢٠١٤ز





منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

# فەزل و گەورەیی نوێژی جەماعەت

زیاترلە ( ٥٠ ) سوودوقازا نجدا
بە بەلگەی قورئانوسوننەت


لەنووسینی
باوکی عبدالماليك


پێداچوونەوەی
م/سیروان شێروانی
پێشنوێژو وتارخوێنی مزگەوتی
( خدرسوارە ) لەهەولێر


١٤٣٥-ك ٢٠١٤-ز

بسم الله الرحمن الرحيم

ناوی کتێب: فەزل و گەورەیی نوێژی جەماعەت
نوسینی: باوکی عبدالمالیك
پێداچوونەوەی : م/سیروان شێروانی
چاپی یەکەم /٢٠١٤
دیزان و بەرگ: خەلیل هیدایەت مام شێخ
شوێنی چاپ: چاپخانەی رۆژهەلأت/ هەولێر
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی
( ٤٣٠ )ی ساڵی ٢٠١٤ ی پێدراوە



# پێشەکی

إنَّ الْحَمْدَللَه نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذ بِالله مِنْ شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَمِن سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ الله فَلاَ مُضِلَ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَ اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيْكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾
آل عمران: ١٠٢

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء: ١

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾
الأحزاب: ٧٠ - ٧١

فإنّ خير الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد (ﷺ)، وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار، وبعد:

سوپاس بۆ خوای گەورە کە ئێمەی بەجوانترین شێوە دروست کردووەو ڕێزی لێ ناوین بەسەر هەموو مەخلوقەکانی تردا، قورئانی پیرۆزی بۆ ناردووین و پێغەمبەری بۆ ناردووین تا ئایینمان بۆ ڕۆشن بکاتەوە ئێمەی بەندەش بەدەم بانگەوازەگەی بڕۆین و ملکەچی بین، تاخودای خۆمان بناسین و بزانین داوای چیمان لێ دەکات جێ بە جێی بکەین، وە چیمان لێ قەدەغە دەکات خۆمان لێی لابدەین.

برای سەنگین: ئەم نامیلکەی بەردەستت بریتیە لەکۆکردنەوەی چەند فەرمودەیەکی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر سوودو قازانج و گەورەیی و خێری نوێژی جەماعەت. ئەم کۆکراوەش بەمەبەستی ئەوەیە چونکە زۆربەمان بێ ئاگاین لەم خێرو پاداشت و موژگێنیە خۆشانەی سەروەرمان (ﷺ)، نازانین بەهۆی نەچوو نمان، چ زەرەرێکمان لێ دەکەوێ، مەگەر هەر لەقیامەتدا هەستی پێ بکەین کەچەند زەرەمەندو پەشیمانین. چونکە تاقە عیبادەتێکە لەنێو عیبادەتەکاندا ڕۆژێ پێنج جار بانگەوازی بۆ دەکرێ و بەر گوێمان دەکەوێ، بۆیە بەڕاستی ئەو کەسەی وەڵامی ئەم بانگە نەداتەوەو نەڕوات بەدەم ئەم بانگە ئەوە هیچ بەڵگەیەکی پێ نیە لەڕۆژی قیامەتدا، بلێ کەس منی ئاگادار نەکردۆتەوە لەئاگری دۆزەخ و لەژیانی سەرفرازی چونکە هەموو ڕۆژێ پێنج جار تۆ بانگ دەکرێی بۆ: (حي على الصلاة = حي على الفلاح) واتە: (وەرن بۆ نوێژی جەماعەت، وەرن بۆ سەرفرازی وەرن خۆتان ڕزگار بکەن لەناخۆشیەکانی قیامەت و لەئاگری دۆزەخ)، بزانە نوێژی جەماعەت خێری زۆر زۆرە بەجوانی سەیری بکەو

لێی ووردببەوە، جا بزانە بەباسکردنی هەر فەرموودەیەك لەفەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) قازا نجەکانی نوێژی جەماعەتت بۆ روون دەبێتەوە، یا زەرەرەکانی نەچوونت بۆ نوێژی جەماعەت بۆ دەردەخات، وە ئەگەر تا ئێستا تۆ لێی بێ بەشی و نەت زانیوەو ئاگات لێی نەبووە. داواکارم لەخودای گەورە ئەم کارەمان لێ وەرگرێ و بیکاتە توێشووی قیامەت بۆمان، لەگوناهەکا نمان خۆش بێت، لەکەمو کوریەکا نمان ببوری، ئەگەر راستیمان پێکابێ ئەوە لەخودای گەورەوە بووە، وە ئەگەر کەم و کوڕی و هەڵەمان بووبێ ئەوە لەنەفسی خۆم و لە شەیتانەوە بووە.

## سوودەکانی نوێژی جەماعەت:

أ- نوێژی جەماعەت لەژێر تیشکی پرشنگداری قورئانی پیرۆزەوە:

**یەکەم:** جێ بەجێ کردنی فەرمانی خودای گەورەیە وەك دەفەرمووێ:

﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرْكَعُوا۟ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾ (البقرة: ٤٣)

واتە: (نوێژ بکەن لەگەڵ نوێژکاران).

**دووەم:** مزگەوت و نوێژی جەماعەت پیاوی خۆڕاگرو خواویست و لەخودا ترس پەروەردە دەکات، وە چاکترین پاداشت و بەخششی خودا بۆ ئەو جۆرە کەسانەیە، وەك خودای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ فِى بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْءَاصَالِ ﴿٣٦﴾ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ

﴿ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالْأَبْصَارُ ﴿٣٧﴾ لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِ ۗ وَاللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٨﴾ ﴾ النور. واتە: (لەمزگەوتانێكدا كەمۆڵەتی داوە كەبەگەورەو پاك ڕاگیرێ، زیكرو یادی خودای تێدا بكرێ، لەو مزگەوتانەدا تەسبیحاتی خوا دەكەن لەبەیانی و ئێوارانداﷺ پیاوانێك كەبازرگانی و كڕین و فرۆشتن بێ ئاگایان ناكات لەیادی خواو نوێژ كردن و زەكات دان، لەڕۆژێك دەترسن دڵ و چاوەكان دەگۆڕێن* تا خوا پاداشتیان بداتەوە بەچاكترین ئەوەی كردوویانە وە لەبەهرەی خۆیەوە زیاترییان پێ دەدات، وە خوا ڕزق و ڕۆزی دەدات بەهەر كەسێ كەبیەوێ بەبێ ژمارە)

ب- نوێژی جەماعەت لەژێر ڕۆشنایی فەرموودە پاك بێگەردەكانی سەروەرمان (ﷺ):

یەكەم: بەكردنی هەر نوێژێكی جەماعەت پاداشتی حەجێكت بۆ دەنووسرێ، بەڵگەشمان فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ) كە دەفەرمووێ: ((من مشى إلى صلاة مكتوبة في الجماعة، فهي كحجة، ومن مشي الى صلاة التطوع فهي كعمرة نافلة)) حديث حسن، صححه الألباني. واتە: (هەر كەسێك بچێتە مزگەوت بۆ نوێژێكی فەرز بەجەماعەت بكات، وەك ئەوەیە حەجێكی كردبێت، وە هەر كەسێك هەنگاو بنێت بۆ نوێژێكی سوننەت وەك ئەوەیە عومرەیەكی كردبێت)

دووەم: بە ئەنجامدانی هەر نوێژێكی جەماعەت جێگایەكی حەوانەوەت بۆ دروست دەكرێت لەبەهەشت، وەك سەروەرمان (ﷺ) دەفەرمووێ: ((مَنْ غَدَا

إلى الْمَسْجِدِ أوْ رَاحَ أعَدَّالله لَهُ نُزُلاً فِي الْجَنَّةِ كُلَّما غَدَا أوْ رَاحَ)) رواه البخاري ومسلم.

واته: (هەر کەسێك سەر لەبەیانیەك بچێتە مزگەوت، یا ئێوارەیەك بچێتە مزگەوت، خودای گەورە بەهەر ڕۆیشتنێکی بۆ مزگەوت جێگایەکی حەوانەی لەبەهەشت بۆ دروست دەکات)

**سێ یەم:** دەبێتە هۆی ڕزگار بوونت لەئاگری دۆزەخ و ڕزگار بوونت لە دووڕویی و (نفاق) بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیەی خۆشەویستمان (ﷺ) کە دەفەرمووێ ((مَنْ صَلَى لله أرْبَعِينَ يَوْمَاً فِي جَمَاعَةٍ يُدْرِكُ التَّكْبِيرَةَ الأُولَى كُتِبَ لَهُ بَرَاءَتَانِ بَرَاءَةٌ مِنَ النَارِ و بَرَاءَةٌ مِنَ النِّفَاقِ)) ورد في صحيح الجامع الصغير رقم (٦٣٦٥)، وهو حديث حسن لغيره. واته: (هەر کەسێ (٤٠) چل ڕۆژان بۆ خودا نوێژەکانی بەبەردەوامی لەمزگەوتدا بکات بەمەرجێك بە(الله أكبر)ی -نوێژ دابەستن- ڕابگات، خودای گەورە لەدوو شتان بێ بەری دەکات: یەکەم: لەئاگری دۆزەخ. دووەم: لەدووڕویی و (نفاق).

**چوارەم:** سوودێکی تری نوێژی جەماعەت ئەوەیە: لەلایەن خودای گەورەوە زەمانەتت پێ دەدرێت، ئەگەر لەو ڕێگایە بمری دەچیە بەهەشت، وە ئەگەر بمێنی بەسەلامەتی دەگەڕێیتەوە، وەك پێغەمبەری خودا (ﷺ) باسی سێ چین دەکات کەزەمانەتیان پێدراوە لەلایەن خودای گەورە، دەفەرموێ: یەکێ لەم سێیانە: (...وَرَجُلٌ رَاحَ إلى الْمَسْجِدِ فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللهِ حَتَى يتوفاه فيدخله الجَنَّةَ أوْ يرده بما نَال من أجرٍ وغَنيمةٍ) رواه أبو داود (٢٤٩٤)، ورد في صحيح الجامع (٣٠٥٣). واته: (... یەکێکیان پیاوێکە

دەچێت بۆ مزگەوت بۆ کردنی نوێژی جەماعـەت ئـەوە دەستەبەر -زامن- کراوە لەلایەن خودای گەورەوە ئەگەر لەرێگای مزگەوتدا بمـرێ دەیخاتـە بەهەشتەوە، یا دەیگەڕێنێتەوە بە پاداشت و دەسکەوتێکی زۆرەوە)

**پێنجەم:** نوێژی جەماعـەت دەبێتـە نـوورو رووناکی بـۆ رۆژی قیامـەت، بەئاسانی دەپەڕنەوە لەسەر پردی سیرات، چونکە هەموو کەسێك لەبـەر رۆشـنایی نوورەکـەی دەڕوات بەسـەر سـیراتدا ئەنەسـی کـوڕی مالیـك دەفەرمووێ: پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((بَشِرِ الْمَشَّائِينَ فِي الظُّلَمِ إِلَى الْمَسَاجِدِ بِالنُّورِ التَّامِّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)) رواه أبـو داود وابـن حبـان وإبن ماجه، حديث صحيح.

واتە: (مژدە بەو کەسانە بدەن کە بە تـاریکی شەو دەڕۆن بـۆ مزگـەوت بـۆ نوێژی جەماعەت لـەرۆژی قیامەتـدا روونـاکی -نـوری- تـەواویان پـێ دەبەخشین).

**شەشەم:** یەك نوێژی بە جەماعەت خێری (٢٧) بیست و حەوت نوێژی هەیە کـە تـەنها بکرێـت، عبـدالله ی کـوڕی عـەمر (خـودای لێـی رازی بێـت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) کەفەرموویـەتی: ((صَلَاةُ الْجَمَاعَةِ تَفْضُلُ صَلَاةَ الْفَذِّ بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً)) رواه البخاري.

واتە: (نوێژی جەماعەت خێری زیاترە لەنوێژی تـاك بەبیسـت و حـەوت (٢٧) پلە -خێر-.

**حەوتەم:** وە لەنوێژی بەکۆمەڵ ئـەو هـەموو سـوودانەت دەسـت دەکـەوت: خێری بیست و پێنج (٢٥) چەندانە خێری زیـاترە، وە بەهـەر هـەنگاوێك

پلەیەکت پێ بەرز دەبێتەوە، وە گوناهێکت پێ رەش دەبێتەوە، وە فریشتەکان سەڵاواتت لەسەر دەدەن، وە چەند بمێنییتەوەو دابنیشی وەك ئەوەیە لەناو نوێژدا بێت وایە، وەك سەروەرمان (ﷺ) دەفەرمووێ: ((صَلاَةُ الرَّجُلِ فِي جَمَاعَةٍ تَضْعَفُ عَلَى صَلاَتِه فِي بَيْتِه وَسوقِه خَمْساً وَ عِشْرِينَ ضِعْفاً، وَذلِكَ أنَّهُ إذا تَوَضَّأَ فَأحْسَنَ الْوضُوءَ ثُمَّ خَرَجَ إلى الْمَسْجِدِ لا يُخْرِجُهُ ألا الصَّلاةُ لَمْ يَخطُ خُطوةً ألا رُفِعَتْ لهُ بِها دَرَجَةٌ وَحُطَّ عَنه بِها خَطِيئَةٌ، فَإذا صَلى لم تزلِ الملائكةُ تُصَلي عَليهِ مَادامَ فِي مُصَلاَّهُ مَالم يُحْدِث: اللهُمَّ صَلِّ عليه. اللهُمَّ ارحمهُ وَلَا يَزالُ فِي صَلاةٍ ما انتَظَر الصَلاةَ)) متفق عليه وهذا لفظ البخاري.

واتە: ( پاداشتی نوێژی بەجەماعەت لەمزگەوت بە (٢٥) بیست و پێنج نوێژە، بەرامبەر ئەو نوێژەی کە لەماڵ یا بازاردا دەکرێت، ئەمەش ئەگەر دەست نوێژێکی تەواوو رێك و پێك بشوات، ئینجا بەرەو مزگەوت بەرێ بکەوێت، تەنها بەمەستی نوێژ دەرچێت، ئەو کەسە هەر هەنگاوێ باوێت پلەیەك بەرز دەبێتەوە، گوناهێکی رەش دەبێتەوە، وە کەنوێژی کرد تا لەجێگەکەی خۆیدا بمێنێتەوەو دەست نوێژی نەشکێت، ئەوە فریشتەکان لۆیان دەپارێنەوە دەڵێن: ئەی خودایە رەحمی پێ بکە، بەم شێوەیە دەبێت تا چاوەڕوانی نوێژ بکا وەك ئەوەیە کە لەنوێژدا بێت).

ئەبو هورەیرە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لا يزالُ أحَدُكُمْ فِي صَلاةٍ ما دامَت الصَلاةُ تُحْبِسُهُ، لا يَمْنَعُهُ أن يَنْقَلِبَ إلى أهْلِه إلا الصَلاةُ)) متفق عليه. واتە: (هەر کەسێك لەئێوە لەمزگەوت

بمێنێتەوە، وەك ئەوەیە لەنوێژدا بوو بێت، بـەو مەرجـەی جگـە لەنوێـژ هیچی تر قەدەغەی نەکات لەگەڕانەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵەکەی).

هەشتەم: هەر کەسێ نوێـژی (عیشـاو بـەیانی) بەجەماعـەت بکـات وەك ئەوەیە هەموو شەوە تا بـەیانی شـەو نوێـژی کردبێـت، وەك پێغەمبـەری سەروەرمان (ﷺ) دەفەرمووێ ((مَنْ صَلى الْعشاءَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأنَمَا قَامَ نِصف اللَيْلِ وَمَنْ صَلى الصُبْحَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأنَمَا قَامَ اللَيْلَ كُلَهُ)) رواه مسلم، ورد في صحيح الجامع (٦٣٤١). واتە: (هەرکەسێك نوێـژی (عیشـا) بەجەماعەت بکات وەك ئەوەیە تـاکو نیوەی شەو شەو نوێـژی کردبێـت، وە ئەوەی نوێژی بەیانی بەجەماعەت بکات وەك ئەوەیە هەموو شـەوەکە شـەو نوێژی کردبێت).

نۆیەم: رزگارت دەکات لەسیفەتێکی دووڕوویی -موونافیقی-، ئەبو هورەیرە (خوای لێی رازی بێت) دەفەرمووێ: پێغەمبەری خـودا (ﷺ) فەرموویـەتی: ((إنَ أثْقَلَ صَلاةٍ عَلى الْمُنَافِقِينَ صَلاةُ الْعِشَاءِ وَصَلاةُ الْفَجْرِ وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لأتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْواً)) رواه المسلم. واتە: (قورسترین نوێژ لەسـەر دوو ڕووان -موونافیقان- نوێژی بەیانی و عیشایە، ئەگەر بـزانن چ پاداشـت و خێرێکی تێدایە ئەوا بە گاگۆلکێش بوایە دەهاتن بۆی).

دەیەم: رزگارت دەکات لەهەڕەشـەی پێغەمبـەری خۆشەویسـت (ﷺ) ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێـی رازی بێـت) دەفـەرموێ: پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) فەرموویەتی: ((لَقَدْ هَمَمْتُ أنْ آمُرَ بِالصَلاةِ فَتُقَامَ ثُمَ آمُرَ رَجُلاً فَيُصَلِي بِالنَاسِ ثُمَ أنْطَلِقَ مَعِي بِرِجَالٍ مَعَهُمْ حُزَمٌ مِنْ حَطَبٍ إلى قَوْمٍ لايَشْهَدُونَ

الصَلاة فَأُحَرِقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ بِالنَارِ)) رواه البخـاري. واتــە: (ویستم بە پیاوێك بڵێم لەجیاتی من پێش نوێژەكە بۆ خەڵكی بكات، منیش لەگەڵ كۆمەڵێكدا بچین بۆ سەر ئەو ماڵانەی كە پیاوەكانیان دوا دەكەون لەنوێــژی جەماعەت بەباوەشە دارێكەوە بۆ ئەوەی ماڵەكانیان بەسەردا بسووتێنم).

یازدەهەم: بەهۆی نوێژی جەماعەت لەرێگادا بەهەر هەنگاوێك خێرێكت بۆ دەنووسرێت، وە گوناهێكت لێ ڕەش دەبێتــەوە، قــەتادە (خــودا لێــی رازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ((حِينَ يَخْرُجُ الرَجُلُ مِنْ بَيْتِهِ إِلى مَسْجِدِهِ فَرِجْلٌ تُكْتَبُ حَسَنَةً وَرِجْلٌ تَمْحُو سَيِئَةً)) ورد في صحيح الجامع، رقم: (٧٠٥). واتە: (كاتێ كەسێك دەچێتە دەرەوە لەماڵەكەیــەوە بۆ مزگەوت بەهەر هەنگاوێك خێرێكی بۆ دەنووسـرێت، وە گونــاهێكی لــێ ڕەش دەبێتەوە).

دوازدەهەم: سوودێكی تری نوێژی جەماعەت، خۆشەویستترین كار ئــە نجام دەدەیت، كەخودای گەورە خۆشحاڵ دەبێــت پێــی وەك لــەو فــەرموودەی كــە عبدالله ی كوری عومەر (خودا لــەخۆی و بــاوكی رازی بێــت) دەفــەرمووێ، پێغەمبــەری خــودا (ﷺ) دەفــەرمووێ: ((إن الله ليعجب من الصلاة في الجمع)) رواه أحمد، صححه الألباني في سلسلة الصحيحة. واتــە: (خــودای گەورە خۆشحال – سەرسام- دەبێت لەنوێژی ئەو كەسەی كــە بەجەماعــەت نوێژەكەی ئە نجام دەدات)

سێزدەهەم: دەبێتە میوانی ماڵی خودای گــەورە، ئــەبی ســەعیدی خــودری (خودا لێی رازی بێت) دەفەرمووێت: پێغەمبەری خــودا (ﷺ) فەرموویــەتی:

خودای گەورە دەفەرمووێ: ((ان بيوتي في الأرض المَساجد وان زواري فيها عمارها)) رواه ابو نعيم بسند ضعيف. واتە: (بەڕاستی ماڵەکانی من لەسەر زەویدا مزگەوتەکانە، وە ئەوانەی دێنە مزگەوت ئاوەدان کەرەوەی مزگەوتەکانن).

**چواردەهەم:** شەیتان ناتوانێ بەسەر نوێژ خوێنی بەکۆمەڵدا زاڵبێت، وە ناتوانێت لەکۆمەڵی موسڵمانان دای بڕێنێت، ئەبو دەردا (خودا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێ: لە پێغەمبەری خودام بیستوە (ﷺ) فەرموویەتی: ((مَا مِنْ ثلاثة قريَةٍ وَلا بَدْوٍ لا تُقامُ فِيهِم الصَّلاةُ إلا قد اسْتحوذَ عَليْهم الشيطانُ فَعَليْكُمْ بِالجَمَاعة فإنَما يأكلُ الذئبُ مِنَ الغَنَمِ القاصية)) رواه أبوداود والنسائي، بسند حسن.

واتە: (نەهاتووە سێ کەس لەدێیەك یا لەدەشتێکدا بن و نوێژ بەجەماعەت نەکەن، شەیتان بەسەریاندا زاڵ دەبێت، کەوابوو پێویستە موسڵمانەکان هەمیشە نوێژ بەجەماعەت بکەن، چونکە گورگ ئەو مەڕە دەخوا کە لەڕانە مەڕ ابڕاوە).

**پازدەهەم:** سوودیکی تری ئەوەیە ئەوەی دەچێت بۆ نوێژی جەماعەت تادێتەوە شوێنی هەنگاوەکانیان دیاری دەکرێت و دەنووسرێت، ئەمەش بۆ قیامەت سوودێکی زۆری دەبێت، وەك سەرووەرمان (ﷺ) سەبارەت بەبنەماڵەی سەلەمە کاتێك ویستیان ماڵیان ببەنە ناو مەدینە بۆ ئەوەی لەمزگەوت نزیك بن، پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) پێیانی فەرموو: ((يَا بَني سَلِمَة دِياركم تُكْتَبْ ءاثارَكُمْ دياركم تكتب ءاثاركم)) رواه

مسلم. واتە: (ئەی بنەماڵەی سەلەمە لەشوێنی خۆتاندا بمێننەوە، چونکە بەمانەوەو هاتووچۆتان بۆ مزگەوت شوێنەوارتان دیاری دەکرێ و دەنووسرێ – پاداشتتان دەدرێتەوە -).

پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرموێ: ((إنَّ أعظم الناس أجراً في الصلاة أبعدهم إليها ممشىً فأبعدهم)) رواه مسلم، ورد في صحيح الجامع (١٠٦٥). واتە: (لەهەمووکەسێك پاداشت و خێر گەورەترو زیاتر لەنوێژەکەیاندا ئەو کەسانەن کە لەدوورەوە دێن بۆ مزگەوت تا رێگاکانیان دوورتر بێت پاداشتەکەیان گەورەیە).

**شازدەهەمین:** لەقیامەتدا لەژێر سێبەری خودای گەورەدا دەبێت، کە لەو رۆژەدا هیچ سێبەرێك نیە، جگە لەسێبەری عەرشی خودای گەورە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێ: ((سَبْعَة يظلهم الله في يَوْمَ لاظل إلا ظله .... رَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَقٌ في الْمَسَاجِدِ...)) رواه البخاري ومسلم. واتە: (حەوت چین لەژێر سێبەری خودای گەورەن لەو رۆژەی کەهیچ سێبەرێك نیە جگە لەسێبەری ئەو نەبێت، ئایا دەزانی یەك لەوانە کێ یە؟ پیاوێکە دڵی بەردەوام پەیوەست بێت بەمزگەوت، کەنوێژێکی کرد دڵی هەر لەلای نوێژەکەی ترە بۆ ئەنجامدانی).

**حەڤدەهەمین:** یەکێکی تر لەسوودەکانی نوێژی جەماعەت ئەوەیە، پێش نوێژ کەم و کوری و ناتەواوی نوێژەکەت هەڵدەگری، پاداشتی تەواوی خۆت وەردەگری، ئەبو هورەیرە (خودای لێی رازی بێت) دەفەرمووێ: پێغەمبەری

خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ((يُصَلُّونَ لَكُمْ فَإِنْ أَصَابُوا فَلَكُمْ وَإِنْ أَخْطَئُوا فَلَكُمْ وَعَلَيْهِمْ)) هذا الحديث انفرد به البخاري.

واتە: ( پێش نوێژتان بۆ دەکەین ئینجا ئەگەر بەباشی کردتان ئەوا پاداشتی تەواو بۆ ئێوەیە، وە ئەگەر بەناتەواوی کردتان ئەوا پاداشتی باش بۆ ئێوەیە، گوناهەکەش بۆ ئەوانە )

**هەژدەهەمین:** دەبێتە هیدایەت بۆت، وە نیشانەی بڕوای تەواوە عبدالله ی کوڕی مسعود ( خودا لێی رازی بێت ) دەفەرمووێ: ((لَقَدْ رَأَيْتُنَا وَمَا يَتَخَلَّفُ عَنِ الصَّلَاةِ إِلَّا مُنَافِقٌ قَدْ عُلِمَ نِفَاقُهُ، أَوْ مَرِيضٌ إِنْ كَانَ الْمَرِيضُ لَيَمْشِي بَيْنَ رَجُلَيْنِ حَتَّى يَأْتِيَ الصَّلَاةَ وَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) عَلَّمَنَا سُنَنَ الْهُدَى، وَإِنَّ مِنْ سُنَنِ الْهُدَى الصَّلَاةَ فِي الْمَسْجِدِ الَّذِي يُؤَذَّنُ فِيهِ)) رواه البخاري (٤٦٥)ومسلم.

واتە: ( ئێمە پێمان وابوو کەسێ لەنوێژی بەجەماعەت دواناکەوێت مەگەر دووڕوو-مونافیقێکی- روون و ئاشکرا بێت، یا نەخۆشێك بووایە، ئەگەر نەخۆشیش بوایە دوو کەس دەستیان دەگرت بۆ نوێژەکەیان دەبرد، ئینجا دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا (ﷺ) رێگای ڕاست و هیدایەتی فێرکردین، یەکێك لەو رێگا ڕاستانە نوێژکردنە لەو مزگەوتانەی کە بانگی تێدا دەدرێ ).

**نۆزدەهەمین:** هەر کەسێ بچێتە مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت، بەنوێژەکە ڕانەگات خودای گەورەو خاوەن بەخشش و میهرەبانی خێری تەواوی بۆ دەنووسێت، بەبێ کەم و کوڕی، خۆشەویست (ﷺ) دەفەرمووێ: ((مَنْ تَوَضَّأَ

فَأحْسَنَ الوضوءَ، ثمَّ راحَ فوَجَد النَاسَ قدْ صَلَّوا أعطاهُ اللهُ مثْلَ أجْرِ من صَلّاها لا يَنْقُص ذلكَ منْ أُجُورِهِمْ شَيءَ)) أبوداود رقم: (٥٦٤٠) والنسائي: (١١١/٢)، صححة الألباني. واتە: (هەر کەسێك دەست نوێژێکی جوان بشوات، پاشان بەرێ بکەوێت بۆ مزگەوت ئینجا ببینێ خەڵکان نوێژیان تەواو کردووە بەو چوونەی بۆ مزگەوتەکە خودای گەورە هەمان پاداشتی ئەو کەسانەی بۆ دەنوسێت کە نوێژیان بەجەماعەت کردبوو بێ ئەوەی هیچ لە پاداشتی ئەوان کەم بکاتەوە).

بیستەمین: بەهۆی نوێژی جەماعەت دەبیە دراوسێ - جیرانی - خودای گەورە: أنس کوڕی ئوسامە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إنَ الله ليُناد يَوْمَ الْقيامة أينَ جيراني أينَ جيراني: فتَقُولُ الْمَلائكَةُ رَبنا، وَمَنْ يَنْبَغي أن يُجاوِرك: قال: أيْنَ عُمَارُ الْمَساجدْ)) رواه أحمد، صححه الشيخ الباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة، رقم (٢٧٢٨). واتە: (خودای گەورە لەرۆژی قیامەت بانگ دەکات و دەفەرمووێ: کوا دراوسێکانم کوا دراوسێکانم: فریشتەکان دەڵێن: ئەی خودای گەورە کێ شایستەی ئەوەیە ببێ بە دراوسێی تۆ، خودای گەورە فەرمووی: کوان ئەو کەسانەی کەمزگەوتەکانیان ئاوەدان دەکردەوە).

بیست و یەکەمین: بەهۆی نوێژی جەماعەت دەچیتە شوێنێك و هۆگری شوێنێك دەبی کەخۆشەویسترین شوێنە لای خودای گەورە، ئەبو هورەیرە (خودا لێی رازی بێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێ: ((أحَبَ الْبلادِ إلى الله مَساجدَها وَأبْغَضُ الْبِلادِ إلى الله أسْواقُها)) رواه

مسلم (٢٣٩). واتە: (خۆشەویسترین وڵات - شوێن - لای خودای گەورە مزگەوتەکانە، وە ناشیرین ترین وڵات -شوێن- لای خودای گەورە بازاڕەکانە) (بەتایبەت لەم سەردەمە) کەوابوو: هەوڵبدە خودای (عزوجل) لە جێگایەك بتبینێ کە خۆشەویسترین شوێنە.

بیست و دووەمین: بەر ڕەحمەتی خودای گەورەو، دوعای چاك فریشتان دەکەوی ئەگەر لەریزی یەکەم بوەستی خودای گەورەو مەلائیکەتەکان سەڵاواتت لەسەر لێ دەدن، سەڵاواتی خودای گەورە بەزەیی و ڕەحمەت باراندنە، سەڵاواتی مەلائیکەتانیش داوای لێخۆشبوون کردنە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێ: ((إنَ اللهَ وَمَلائكَتَهُ يُصَلُونَ عَلى الصَف الأوَلِ)) رواه أحمد وصححه الألباني. واتە: (خودای گەورەو ڕەحمەت و میهرەبانی خۆی دادەبارێنێ، وە فریشتەکانیش داوای لێخۆشبوون دەکەن بۆ ئەو کەسانەی کە لەریزی یەکەم نوێژ دەکەن، ووتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ریزی دووهەمیش فەرمووی: ((وَعَلى الثاني)) هذه الزيادة ضعيف.

بیست و سێ هەمین: خودای گەورە شانازیت پێوە دەکات لای فریشتەکانی خۆی، ئەگەر لەنوێژێك تەواو بوو، چاوەڕوانی نوێژێکی تر بێت، عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاس (رضي الله عنه) دەفەرمووێ لەخزمەت پێغەمبەری خودا بووم (ﷺ) نوێژی مەغریبمان کرد، هەندێ کەس گەڕانەوە، وە هەندێ کەسیش مانەوە چاوەڕوانی نوێژی عیشایان کرد پێغەمبەری خودا (ﷺ) بەخێرا هات بەرەو ئێمە فەرمووی: ((أبْشِرُو هذا رَبُكُمْ قدْ فَتَحَ باباً مِنْ أبْواب السَماءِ يُبَهِيكُمُ المَلائِكَه، قال أُنْظُرُوا إلى عبادِي قدْ قَضَواْ

فَرِیضَةً وَهُمْ یَنْتَظِرُونَ أُخرى)) رواه إبـن ماجـة رقـم (٨٠١) ورد في سلسلة الصحيحة رقم: (٦٦١) للشيخ الألباني. واتە: (مژدە بدەن خـودای گـەورە دەرگایەك لە دەرگاکانی ئاسمانی کردەوە، شانازیتان بـەئێوە دەکـات لای فریشتەکان، دەفەرمووێ: سەیری بەنـدەکانم بکـەن، نوێـژێکیان تـەواو کردووە چاوەڕوانی نوێژێکی تر دەکەن).

**بیست و چوارەمین:** ئەوەی نوێژی بەجەماعەت بکـات خـودای گـەورە مـۆری لەسەر دڵی نـادات و، لـە بـێ ئاگایـان نـاژمێردرێ، بە پێچـەوانەی ئـەو کەسانەی کەنایەن بۆ نوێـژی جەماعـەت، پێغەمبـەری سـەروەرمان (ﷺ) دەفەرمووێ: ((لیَنْتهين أَقْوامٌ عَنْ ودعهـم الجماعـات أو لیَخـتمن الله علـى قلوبهم، ثمَ لیَکونَنَ منَ الغـافلين)) صحیح إبـن ماجـه (١/١٣٢) وصححه الألباني.

واتە: (ئەو کەسانەی کەوازیان لەنوێژی جەماعەت هێنـاوە، یـا واز لـەم کرداره دێنن، یا خودای گەورە مۆر لەسـەر دڵیـان دەدات، پاشـان لـە بـێ ئاگایان دەژمێردرێن).

**بیست و پێنجەمین:** هاتوچـۆ کردنـی مزگـەوت، نیشـانەی تـەقواداری و خواناسی تۆیەو، دەبێتە هۆی دەرباز بوونـت و پەڕینـەوەت لەسـەر پـردی سیڕات و، رازی بوونی خوای گەورەو، دواییش بەدەست هێنـانی بەهەشـت، سەردارمان (ﷺ) دەفەرمووێ: ((الْمَسْجِدُ بَیْـتُ کُـلُّ تَقِـيٍّ وَتَکَفَّـلَ اللهُ لِمَنْ کَانَ الْمَسْجِدُ بَیْتَهُ بالرَّوحِ وَالرحمةِ والجوازِ علـى الصـراط إلى رضوانِ الله: الى الجنة)) رواه الطبراني وضعفه الألباني. واتە: (مزگەوت مـاڵی هـەموو

خواناسێکە، خودای گەورەش بەڵێنی داوە ئەو کەسەی کە مزگەوت بە ماڵی خۆی بزانێ سۆزو میهرەبانی بەسەردا بڕژێنێ و، بەسەر پردی سیڕاتدا دەربازی ببێت ڕەزامەندی خوداو بەهەشت بەدەست دێنێت).

بیست و شەشەمین: هاتووچوی مزگەوت چاوەڕوانی نوێژ لەدوای نوێژ، بەئەندازەی پاداشتی ئێشکگرو سەنگەر نشینی غەزایە لە پێناوی خودای گەورەیە، ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێ: ((أَلا أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَمْحُو اللهُ بِهِ الْخَطَايَا، وَيَرْفَعُ بِهِ الدرجات؟ قالوا: بلى يا رسول الله، قال: إِسباغ الوضوء على المكاره وَكَثْرَةُ الخطا إلى المَسَاجِدْ وَانْتِظَارُ الصَّلاةُ بَعْدَ الصَّلاةِ. فذلِكُمُ الرِبَاطُ، فَذلِكُمُ الرِباط، فَذلِكُمُ الرِباطُ)) رواه مسلم. واتە: (ئایا شتێکتان پێ بڵێم کە خودای گەورە بەهۆیەوە تاوانەکانتان بسڕێتەوەو پلەتان بەرز بکاتەوە؟ ووتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: شووشتنی دەستنوێژی تەواوە لەکاتی زەحمەتی و ناڕەحەتیە، زۆر هەنگاو نانە بۆ مزگەوت، وە چاوەڕوانی نوێژ لە دوای نوێژ، ئەمە وەك سەنگەنشینیە لە پێناو خودای گەورە، ئەمە وەك سەنگەنشینیە لە پێناو خودای گەورە، ئەمە وەك سەنگەنشینیە لە پێناو خودای گەورە).

بیست و حەوتەمین: بەهۆی هەر چوون و هاتنەوەیەکت بۆ مزگەوت خێرو پاداشتت بۆ دەنووسرێت، ئوبەی کوڕی کەعب (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرمووێ: پیاوێك لەئەنساریەکان ماڵی لەهەموو کەس دوورتر بوو لەمزگەوت، هەموو نووێژەکانی بەجەماعەت بوو، هیچ نوێژێکی بێ

جەماعەت نەدەکرد پێیان دەوت: خۆزگە گوێ درێژێکت هەبایە تا لەکاتە تاریك و گەرماکاندا سواری ببای ووتی: پێم خۆش نیە ماڵەکەم لەتەنیشت مزگەوت بێت، بەڵکو من دەمەوێ بەهاتوو چوونم بۆ مزگەوت پاداشتی زۆرم بۆ بنووسرێت! پێغەمبەری خودا (ﷺ) پێی فەرمووو: ((قَدْ جَمَعَ اللهُ لَكَ ذلِكَ كُلَّهُ)) رواه مسلم. واتە: (خودای گەورە هەموو ئەو پاداشتانەی بۆ کۆکردویەوە - هەموویت بۆ نووسراوە -)

بیست و هەشتەمین: هەر کەسێك دەست نوێژێکی چاك و تەواو بشوات، ئینجا بۆ مزگەوت بچێت، خودای گەورە لێی خۆش دەبێت، خۆشەویستمان(ﷺ) دەفەرموێ: ((ومن توضا فاسبغ الوضوء، ثم مشى الى صلاةٍ مكتوبةٍ فصلّاها مع الإمام غُفِر لهُ ذنبه)) رواه ابن خزيمة وصححه الألباني(٢٩٩) في صحيح الترغيب والترهيب. واتە: (هەرکەسێك دەست نوێژێکی تەواوو دروست بشوات، پاشان بۆ نوێژی فەرز بچێتە مزگەوت، خودای گەورە لەهەموو گوناهەکانی خوش دەبێت)

بیست و نۆیەمین: سوودێکی تری نوێژی بەجەماعەت ئەوەیە کاتێ تۆ بەردەوام بی لەسەر نوێژی جەماعەت، هەرکاتێ دیار نەبی مەلائیکەتەکان بەدواتدا دەگەڕێن و هەواڵت دەپرسن، وە ئەگەر نەخۆشبی سەردانت دەکەن. چەند خۆشە مەلائیکەت لێت بپێچێتەوە، سەردانت بکات، خوشەویستمان (ﷺ) دەفەرموێ: ((ان للمساجد أوتاداً، الملائكة جلساؤهم إن غابوا يفتقدهم، وإن مرضوا عادوهم، وإن كانوا في حاجة أعانوهم....)) صحيح السلسلة الصحية(٣٤٠١) حسن صحيح الرقم: (٣٢٩).

واتە: (مزگەوتەکان کۆڵەگانێکیان هەیە فریشتەکان هاورێیانن، کاتێ بزر بن لێیان بەدوایاندا دەگەڕێن، وە ئەگەر نەخۆش بن سەردانیان دەکەن، وە ئەگەر ئیش و کاریان هەبێ یارمەتیان دەدەن).

سێیەمین: سوودێکی تری نوێژی جەماعەت بەجووت کردنی پێیەکانت لەگەڵ نوێژ خوێنانی کۆشکێکت لەبەهەشت بۆ دروست دەکرێ.

سەروەرمان(ﷺ) دەفەرموێت: ((من سدّ فُرجةً رفعه الله بها درجةً وبنى بيتاً له في الجنة)) رواه الطبراني صححه الألباني في صحيح الترغيب رقم (٥٠٥). واتە: (هەر کەسێك کەلێنێکی نێوان خۆی و موسلمانێك پر بکاتەوە، خودای گەورە پلەیەك بەرزی دەکاتەوەو لەبەهەشتدا کۆشکێکی بۆ دروست دەکات).

* موسڵمانی بەرێز: بزانە تا ئێستا چەند کۆشکی وات لەدەستداوە، بەهۆی پابەند نەبوونت بە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ).

* کاتێك مامۆستا پێمان دەڵێت: رێك راوەستن رەحمەتی خواتان لێ بێت کە ئەمە سوننەتی پێغەمبەرە زۆر کەس هەر گوێشی پێنادات، بەڵکو هەر لەسەر پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوامە.

* کەوابوو پێویستە ئەگەر کەسێك پێی ووتی ئەو راوەستانە هەڵەیە بەڵکو سوننەتی پێغەمبەر ئەوەیە شانمان لەئاست شانەکانمان بێت، پێیەکانمان لەتەك پێیەکانمان بێت و روو لەقیبلە بێت.

* بەراستی پێویستە مامۆستایانی ئایینی لەم بابەتە کەمتەر خەمی نەکەن، زۆر پێداگری بکەن لەسەر سوننەتەکان، چونکە مامۆستاو پێش

نوێژەکان پێشەوای خـەڵکن، بۆیـە دەبـێ بۆیـان روون بکەنـەوەو تێیـان بگەینن و پێیان رابگەیەنن.وەبۆماموٚستا رەوایە سەفەکان رێك خا

سی و یەکەمین: بەچوونت بۆ نوێژی جەماعەت خودای گەورە پێ خۆشحاڵە، پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرموێ: ((ما توطن رجلٌ مسلمٌ المساجد للصلاة والذّكر إلّا تبشبش أهل الغائب بغائبهم إذا قدم عليهم)) صححه الألباني في صحيح الترغيب (٣٢٧) وفي سنن ابن ماجة (٨٠٠).

واتە: (هەر پیاوێکی موسڵمان لەشـوێنی خۆیـدا لەمزگەوتـدا دابنیشـێ و بمێنێتەوە بۆ نوێژکردن و یادو زیکری خودای گـەورە، خـودای گـەورە پـێ خۆشـحاڵترە لـەوەی کەکەسـێکی نادیـارو دووری بێتـەوە خـودای گـەورە بەئەندازەی ئەو کەسەو زیاتریش خۆشحاڵە).بەمـەرجێك خـۆی بـە قسـە یاخوت ئامێرێك خەریك نەکات یاخوت تەلەفۆن کردن و ............هتد

سی و دووەمین: گەورەترین و باشترین نوێژی جەماعەتیش نوێـژی بـەیانی رۆژی جومعەیـە، پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) دەفـەرموێ: ((أفضل الصلاوات عندالله صلاة الصبح يوم الجمعة في جماعة)) اخـرج ابـو نعيم صححه الألباني.

(باشـترین نوێـژ لای خـودای گـەورە نوێـژی بـەیانی رۆژی جومعەیـە کـە بەجەماعەت بیکەیت)

سی و سێیەمین: گەورەیی و رێزو نوێـژی جەماعـەت لـەم فەرمودەیـە روون دەبێتەوە کەسەد کەس بەتـاك تاك هەر کەس بۆ خۆی نوێژ بکـات ناگاتـە ئاستی چوار کەس لای خودای گەورە کە بەجەماعـەت بیکـەی پێغەمبـەری

خودا (ﷺ) دەفەرموێ: ((صلاة رجلين يؤم أحدهما صاحبه أزكى عندالله من صلاة ثمانية تترى وصلاة أربعة يؤمهم أحدهم أزكى عندالله من صلاة مائة تترى)) رواه البخاري في التاريخ، والبزار والديلمي وصححه الحاكم والألباني. واتە: (نوێژ کردنی دوو پیاو کەیەکێکیان پێش نوێژی ئەویتریان بکات باشترە لای خودای گەورە لەنوێژی هەشت کەس بەجیا جیا بیکەن، وە نوێژی چوار کەس کەیەکێکیان پێش نوێژیان بۆ بکات باشترە لای خودای گەورە لەنوێژی سەد کەس کە بەجیا جیا بیکەن).

سی و چوارەمین: فەرمودەیەکی پێغەمبەری خودا هەیە (ﷺ) بەپێویستی دەزانم بەبیر خوێنەرانی خۆشەویست بهێنمەوە بۆ ئاگاداری ئەو کەسانەی کەنایەن بۆ نوێژی جەماعەت تا بزانن چەند زیانیان لێ دەکەوێت بەهۆی ئەنجام نەدانی نوێژی جەماعەت، ئەبو هورەیرە (خودا لێی رازی بێت) دەفەرمووێ: کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی: ((إنّ الرَّجُلَ ليُصَلّي ستّينَ سَنَةً وَمَا تُقْبَلُ لهُ صَلاةٌ لعَلَّهُ يُتِمُّ الرُكوعَ ولا يُتِمُّ السجُود ويُتِمُّ السجُود ولا يُتِمُّ الركُوع)) رواه أحمد حسنه الألباني. واتە: (پیاوی وا هەیە (٦٠) شەست ساڵ نوێژ دەکات، بەڵام نوێژەکەی لێ وەرناگیرێت، چونکە کاتێ چەمانەوە –رکوع-ەکەی تەواو بێت، کرنووش –سەجد-ەکەی تەواو نیە، وە ئەگەر کرنووش –سەجد-ەکەی تەواو بێت، چەمانەوە –رکوع –ەکەی تەواو نیە)

بزانە برای بەرێزم: بەس لەبەر ئەوەی – رکوع –و سەجد-ەکەی تەواو نەبێت، نوێژەکەی لێ وەرناگیرێت!!! خۆ ئەگەر ئەو پیاوەی بێت بۆ نوێژی

جەماعەت، لەکەم و کورتی و ناتەواوی نوێژەکەی بەدوورو پارێزراو دەبێت، وەك پێغەمبەری خودا (ﷺ) دەفەرمووێ: ((يُصَلُّون لكُمْ فإن أصابُوا فلكم وإِنْ أخْطئوا فلكُمْ وَعَلَيْهِمْ)) رواه البخاري. واتە: (ئەگەر بەباشی پێش نوێژیان بۆ کردن ئەوە پاداشتی تەواو بۆ ئێوەو بۆ ئەوانە، وە ئەگەر بەباشی پێش نوێژیان بۆ نەکردن گوناهو سزاکەی بۆ ئێوەو ئەوانە).



## ئەوانەی ناچن بۆ نوێژی جەماعەت لەسۆنگەی ئایەت و فەرموودەو ووتەی پێشینە چاکەکاندا :

**یەکەم:** نوێـژی جەماعـەت لەشـەرمەزاریەکی زۆر گـەورەی ڕۆژی قیامـەت دەتپارێزێ، بەڕاستی ئەو ئایەتەی ئێستا بـۆت بـاس دەکـەین بەسـە بـۆ کەسێك کەدڵێکی زیندوو بـەئاگای هـەبێت، ئایەتەکـەش خـودای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾ خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ وَقَدْ كَانُوا۟ يُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمْ سَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ (القلم). واتە: (لەڕۆژی دوایی خودای پـەروەردگار قاچـی خـۆی نیشـانی موسڵمانان دەدات (قاچێکە کە شایستەی دەسەڵات و گەورەیی خـۆی بێـت) نوێژ خوێن خراپ و دووڕووەکان بـانگ دەکـرێن بـۆ سـوژدە بـردن، بـەڵام ناتوانن سـوژدە بـەرن، چـاو شـۆڕ ڕوو ڕەشـن لەشـەرمەزاریاندا، چـونکە لەدونیادا بانگ کرابوون بۆ سوژدە بردن سوژدەیان نەدەبرد بۆ پەروەردگارو دروستکەریان لەکاتێ کەساغ و سەلامەت بوون - دەیاتوانی سوژدە بەرن-).

**دووەم:** پێغەمبـەری خـوداش (ﷺ) لەتەفسـیری ئـەم ئایەتـە پـیرۆزە دەفەرموێت: ((يكشف ربُّنا عن ساقه، فيسجد له كلُّ مؤمنٍ و مؤمنةٍ، ويبقى من كان يسجد في الدنيا رياءً و سمعةً فيذهب ليسجد فيعود

ظهره طبقاً واحداً)) اخرجه البخاري في صحيحه.واتە: (پەروەردگارمان قاچی خۆی دەردەخات (قاچ بریتییە لەسەروی گوزینگ خوار ئەژنۆ) -کەشایستەی دەسەلآت و گەورەیی خۆی بێت، ئێمە چۆنیەتەکەی نازانین-، ئینجا هەموو باوەردارێکی پیاوو ئافرەت سوژدە بۆ خودای گەورە دەبەن و دەچنە سوژدە، بەلآم ئەو کەسانە کە لەدونیادا بۆ ناوو خۆدەرخستن سوژدەیان بردوەو دەرۆن بۆ ئەوەی سوژدە بردنە بەلآم پشتیان دەبێتە یەك پارچەو ناچەمێتەوە -پەنا بەخودا لەم سەرشۆریە-).

جا برایانی بەرێزم بابزانین زانایانی ئەم ئوممەتە لەسەحابەو تابعینە بەرێزەکان پیاو چاکانی پێشوو چۆن تەفسیری ئەم ئایەتەی سورەتی (قەلەم)یان کردووە. ئەوانەی ناتوانن سوژدە بەرن با بزانین کێن و چۆنن چیان کردووەو تا خۆمان لەو سیفەتانە بپارێزین (بە پشتیوانی و یارمەتی خودای گەورە).

**سێیەم:** زانای پایەبەرز ئامۆزای پێغەمبەری خودا (ﷺ) عبداللەی کوری عەبباس (رضي الله عنهما) لەتەفسیری ئەو ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرموێت: (کانوا یسمعون الأذان والنداء للصلاة فلا یستجیبون) بروانە تەفسیری روح المعانی. واتە: (ئەوانەن کەگوێیان لەبانگی نوێژ دەبێت بەدەمی بانگەکە ناچن و وەلآمی نادەنەوە).

**چوارەم:** کعب الأحبار (رەحمەتی خودای لێ بێت) دەفەرموێ: (واللە ما نزلت هذه الآیة إلا في الذین یتخلفون عن الجماعات)) بروانە تەفسیری (البغوي) ٤-٢٨٣ و زاد المسیر ٨-٣٤٢..القرطبي ١٨-٢٥١. واتە: (سوێند

یەخودا ئەو ئایەتە دانەبەزیووە، تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت کە لەنوێژی جەماعەت دوادەکەون ).

**پێنجەم:** سعیدی کوری جوبەیر ( رەحمەتی خودای لێ بێت ) لەتەفسیری ئایەتی: ( **كانوا يسمعون حيّ الفلاح فلا يستجيبون** ) بروانە تەفسیری القرطبي ١٥١/١٨ و روح المعاني ٣٦/٣٩. واتە: ( ئەوانەن گوێیان لە ( حي على الفلاح ) دەبێت، وەڵامی نادەنەوە )

**شەشەم:** ابراهیم النخعی ( رەحمەتی خودای لێ بێت ) دەفەرموێت: ( **أي يُدعَون بالأذان والإقامة فياونه** ) بروانە تەفسیری القرطبي ١٥١/١٨ و روح المعاني ٣٦/٣٩. واتە: ( مەبەست ئەوانەن بانگ دەکرێن بۆ مزگەوت و نوێژی جەماعەت بەبانگ و قامەت بەڵام پشت هەڵدەکەن و وەڵامی نادەنەوە )

**حەوتەم:** ابراهیم التمیمی ( رەحمەتی خودای لێ بێت لە ) دەفەرموێت: ( **يعني يُدعَون الى الصلاة المكتوبة بالأذان والإقامة** ) بروانە تەفسیری البغوی ٢٨٣/٣ ) واتە: ( ئەوانەن بانگدەکرێن بۆ نوێژی بەجەماعەت بەبانگ و قامەت بەڵام گوێی پێ نادەن )

**هەشتەم:** أبو الفرجی ابن الجوزی ( رەحمەتی خودای لێ بێت ) لەتەفسیرەکەی دا دەفەرموێ: ( **وفي هذا وعيد لمن ترك الصلاة الجماعة** ) بروانە تەفسیری زادالمسیر ٩٦/٣ ) واتە: ( لەم ئایەتەدا هەڕەشەیەکی زۆر گەورە هەیە بۆ ئەو کەسانەی کەواز لەنوێژی جەماعەت دێنن )

**نۆیەم:** ابن القیم الجوزی ( ڕەحمەتی خودای لێ بێت ) دەفەرموێت: چەندین لەزانایانی پێشین لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿ وَقَدْ كَانُوا۟ يُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمْ سَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ فەرمویانە: مەبەست بەم ئایەتە وتەی بانگبێژە: ( حی علی الصلاه، حی علی الفلاح )ە واتە: بانگ کردن لەم ئایەتە بۆ سوژدەبردن بریتیە لەسوژدەی ناو نوێژە کە بەجەماعەت لە مزگەوت ئەنجامی بدەن ).

* بەڵام هەندێ کەس گوێی پێ نەداوەو کەمتەرخەمی کردووە سەرەنجام تووشی ئەو سزا سەختە بووە لە پاشەڕۆژدا.

**دەیەم:** ئیمام فخر الرازی ( ڕەحمەتی خودای لێ بێت ) لەتەفسیری ئایەتی: ﴿ وَقَدْ كَانُوا۟ يُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمْ سَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ دەفەرموێت: (یعني حیث کانوا یُدعَون الی الصلوات بالأذان والإقامة و کانوا سالمین قادرین علی الصلاة وفي هذا وعید لمن قعد عن الجماعة ولم یستجب الموذن الی إقامة الصلاة في جماعة )

واتە: ( ئەو کەسانەی بانگ دەکران بۆ نوێژە فەرزەکان بە بانگ و قامەت، لەگەڵ ئەوەدا ساغ و سەلامەت بوون و نەخۆش نەبوون و دەیان توانی نوێژەکانیان بەجەماعەت بکەن، ئەم ئایەتە پیرۆزە هەڕەشەیەکی گەورەی تێدایە بۆ ئەو کەسانەی کە دادەنیشن و نایەن بۆ نوێژکردن بەجەماعەت و وەڵامی نادەنەوە بۆ ئەوەی نوێژەکانیان بەجەماعەت بکەن ).

**یازدەهەم:** ئەوانەی گوێیان لەبانگ دەبێ، پێویستە بێن بۆ مزگەوت، ئەگەر نا لێی وەرناگیرێ، مەگەر عوزرێکیان هەبێ، سەردارمان (ﷺ) دەفەرموێت: ((مَن سمع النداء فلم يُجب فلا صلاة له إلّا من عُذر)) رواه البخاري، وورد في صحيح الجامع: (٧٥٨٣). واتە: (هەر کەسێك گوێی لەبانگ بێت، وەلامی نەداتەوە نەچێت بۆ مزگەوت ئەوا نوێژەکەی لێ وەرناگیرێ، مەگەر بەهۆی پاساو –عوزر- یکەوە بێت)

**دوازدەهەم:** عائیشەی دایکی ئیمانداران (خودا لێی رازی بێت) دەفەرموێت: ((مَن سمع النداء فلم يُجب لم يُرد خيراً، أو لم يُرد به)) مصنف ابن أبي شيبة (٣٠٣/١). واتە: (هەر کەسێك گوێی لەبانگ بوو، وەلامی نەدایەوەو نەیەت بۆ مزگەوت ئەواخێرو چاکەی ناوێت، یان خێرو چاکەی ئەو کارەی ناوێت).

**سێزدەهەم:** ئیبن عەبباس (رضي الله عنه) دەفەرموێت: ((مَن سمع حيّ على الفلاح، فلم يُجب فقد ترك سنّة محمّد رسول الله (ﷺ)) رواه الطبراني وحسنه الألباني (١٠٤/١) في صحيح الترغيب والترهيب ٤٣٢. واتە: (هەر کەسێك گوێی لە (حی علی الفلاح) بێت و وەلامی نەداتەوەو نەچێت بۆ مزگەوت ئەوە سوننەتی پێغەمبەری خودای واز لێ هێناوە (ﷺ))

**چواردەهەم:** ئیبن مەسعود (رضي الله عنه) دەفەرموێت: (هەرکەسێك حەز دەکات بەیانی – رۆژی دوایی- بەموسڵمانی بگاتەوە خودای گەورە، با ئاگاداری ئەو نوێژانە بێت، لەهەر شوێنێك بانگ درا بۆی بچێت، چونکە بەراستی خودای گەورە رێگاکانی رزگاری و هیدایەتی بۆ پێغەمبەرەکەی داناوە (ﷺ)

وە نوێژەکان لەو ڕێگا ڕزگار کەرانەن، وە ئەگەر ئێوە لەماڵـەکانتان نوێـژ بکـەن ئـەوە دواکـەوتوون لەسـوننەتی پێغەمبەرەکـەتان و وازتـان لێـی هێناوە، هەر کاتێکیش سوننەتی پێغەمبەرەکـەتان واز لـێ هێنـا گـومڕاو سـەرگەردان دەبـن، وە ئێمـە - هاوەڵـان- کـەسمان دوانەدەکـەوتین لەنوێژەکان مەگەر کەسێکی دووڕووی ڕوون و ئاشکرا بوایـە، پیـاو هـەبوو دووکەس ئەچوونە بن باڵی ئەیان هێنا لەریزەکانی نوێـژ رایـان دەگـرت) فقه السنه بە کوردی لا پەرە (٣٧٥) وە موسلیم گێراویەتیەوە.

پازدەهەم: ئەبو هوریرە (ﷺ) دەفەرموێت: ((لـإن یمتلـيء أذُن ابـن آدم رصاصاً مُذاباً خیرٌ له من أن یسمع المنادي ثُمّ لا یستجیبه)) مصنف ابـن أبي شیبة ٣٠٣/١. واتە: (ئەگەر گوێی ئادەمیزاد پڕ بکرێـت لـەقورقوشمی تواوە باشترە لەوەی گوێی لەبانگبێـژ بێـت و پاشـان وەڵامـی نەداتـەوەو نەچێت بۆ مزگەوت).



## نموونەیەکی هەنجەت بڕ بۆ هەموو چاوساغێك:

سەیرکە کەسێکی نابینا یا شەل یا ناتەواو پاساو - عوزر- ی بۆ نیە کە نەیەن بۆ مزگەوت، کەوابوو ئەی برای گەورەم تۆ چ پاساو - عوزری-ێکت هەیە، ئەبو هورەیرە (ﷺ) دەگێڕێتەوە: ((أتى النبي (ﷺ) رجل أعمى فقال: يارسول الله إنّه ليس لي قائد يقودني إلى المسجد، فسأل رسول الله (ﷺ) أن يُرخّص له فيُصلّي في بيته، فرخّص له، فلمّا ولّى دعاه فقال: (هل تسمع النداء بالصلاة)، قال: نعم، قال: فأجب) رواه مسلم. واتە: (پیاوێکی نابینا (کوێر) هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) من کەسم نیە دەستم بگرێت بۆ مزگەوت، داوای کرد کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) مۆڵەتی بدات کە لەماڵەوە نوێژەکانی بکات، بۆیە مۆڵەتی دا، کاتێ پیاوەکە ڕۆیشت بانگی کردەوە پێی، فەرموو: ئایە گوێت لەبانگ دەبێت؟ وتی: بەڵێ، فەرموی: دەی کەواتە لەسەرت پێویستە وەڵامی بدەوە - وەرە مزگەوت بۆ نوێژ- ).



به پشتیوانی خوای گەورە تەواو بوو

هیوادارم لەدوعای خێر بێ بەشمان نەکەن

﴿ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾

پێداچوونەوەی

م/سیروان شێروانی

٠٧٥٠٤٤٦٧١٣٠



ئەی تۆ چ عوزرێکت هەیە کە نوێژ ناکەی!!